کە بەتەواوەتی جەماوەر دەناسێ. وە بەتەواوی ئەو ڕێگایانە بناسێ کە وەڵامدانەوە لای ئەو جەماوەرە دەخولقێنێ.

٢- هۆکاری بەدیهێنان و تازەکردنەوە: لەخستنەڕوودا لەڕۆتین و دووپات کردنەوە دوورکەوێتەوە. چونکە ئەگەر شێوازی بەردەوام دووبارە بۆ ئەو کاتە دەبێتە مایەی بێزاری.

٣- ڕۆح سوکیو نوکتە ئامێزی : ئەگەر پڕوپاگەندەچی روح سوک نەبێو کاریگەری ڕۆحی بۆ سەر رای گشتی نەبێ، حەتمەن تێکدەشکێ. نوکتەش زۆرجار بووە بەهۆی ڕۆخانی رابەرەکان.

٤- دووپات کرنەوە : بەکارهێنان و دووپاتکردنەوەی هەندێ دەستەواژەو دروشم بەشێوەیەکی دیراسەکراوو شێوازی جۆربەجۆر زۆرجار بەرەنجامی باشی دەبێ.

٥-پڕوپاگەندە لەدەرگاوە بۆ دەرگا: بۆ نموونە پڕوپاگەندەچی هەڵدەستێ بە دانانی وێنەی پێشەوای وڵات لە ماڵ، هاوڵاتیان و ڕێگاوبان و شەقام و نوسینگەو شوێنی بازرگانیو گۆڕەپانە گشتییەکان. ئیتر هاووڵاتی بەیانی کە لەماڵەوە دەردەچێو هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ وە هەمیشە وێنەکانی لەپێش چاو بێ.

بەپشت بەستن بەم راستیە *دەتوانرێ شاڵاوی پڕوپاگەندە بکرێ بە پێنج قۆناغەوە کە دیاری ماوەکەی لەسەر سروشتی ئەو جەنگە بنەڕەتیە وەستاوە کە خودی پڕوپاگەندەکە بەرپای دەکات . قۆناغەکانیش ئەمانەن* :

١- **قۆناغی وروژاندنی گێروگرفتەکە :** قۆناغێکی چۆنیەتیە زیاتر لەوەی پڕوپاگەندەو ئاراستەکردن بێ. وروژاندنی تەنگ و چەڵەمەو خستنەڕووی لەدوای کەش و هەوایەکی گرژو نائارامەوە.

٢- **قۆناغی ئامادەبوون بۆ شاڵاوە پڕوپاگەندەکە :** گوێزانەوە لە ڕاگەیاندنەوە بۆ پڕوپاگەندە بەمانا هونەرییەکەی بە سروشتێکی ستراتیژی دیاریدەکرێ.

٣- **قۆناغی هێرشی راستەوخۆ :** لەمەیدانی راستەقینەی جەنگ دا کورت و بەهێزو خەست و مەرحەلیو یەکلاییکەرەوە دەبێ.

٤- **قۆناغی تێکشکاندنی دوژمن :** تێکشکاندنی هێزە نەیارەکانی پڕوپاگەندەکە پێویستە بە تێکشکاندنی ئەو هێزانە دەست پێبکرێت کە ئاسانن و کەمترین بەرگری لەخۆیان نیشان دەدەن.

٥- قۆناغی قەبەکردنی ئامانجەکان : بۆ بەهێزکردنی ئەو ناوەندانەی کە لە قۆناغەکانی پێشوودا بەدەستمان هێناون.

**شەشەم:** دەستکاری کردن : دەستکاری کردنی هەواڵ بەجۆرێ دوای دەستکاری کردنەکە واتایەکی زۆر ترسناک بەخۆیەوە دەگرێ. وتەیەک بەخراپی سودی لێوەردەگیرێت.

**حەوتەم:** قرتاندن (لابردن و سڕینەوە): ئەگەر ویستت رای گشتی پێشەوایەکی لەبیربچێتەوە ئەوا وێنەو هەواڵ و چالاکییەکانی لەناوا مەهێڵەو لەبەر چاوو گوێ لایبەرە.

**هەشتەم:** بۆ هەرکەسەو پڕوپاگەندەی خۆی: پێویستە هەموو دەوڵەتێ یاخود هەموو حیزبێ پڕوپاگەندەی تایبەتی خۆی هەبێ. لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی رێسا گشتییەکانی پڕوپاگەندەی سیاسیدا.

**نۆیەم:** ئاسانکاریی : بەکارهێنانی شێوازێی سادەو بەش بەش کردنی بیرۆکەی پڕوپاگەندە.

**یانزەیەم:** قەبەکردن و هاتو هاوار دروست کردن: زل کردنی و لەبەکردنی هەواڵێکی دیاریکراو نوسینی لێکدانەوەو وتاری جۆراوجۆر لەسەر ئەم هەواڵە بەو مەبەستەی هەواڵەکە بە بەرینترین جەماوەری خەلک بگات.

**یازدەهەم:** شێوازی دەرفەت قۆزتنەوە: پێویستە زۆر بەخێرایی دەرفەت بقۆزرێتەوە. جا ئەم دەرفەتە هەواڵێ بێ یان وتارو وتەو رووداوێ بێ. ئەو کاتە دەست و بردو بێدواکەوتن نەخشەیەکی پڕوپاگەندیی دیاری دەکرێت.

**دوازدەهەم:** شێوازی چەقی بازنە: ئەم شێوازە کاتێ بەکاردێ کە بمانەوێ تاقیکردنەوەمان دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو دەستکەوێ. یەکەم جار پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە ئامانجی شالاوەکە لەگەڵ هەست و نەستی خرۆشاوی جەماوەر بگونجێ. گەر دڵنیابووین لەوە ئیتر دەبێ کار لەسەر فراوانکردنی بازنەکە بدرێ.

**سیانزەهەم:** شێوازی (هاوبەشی فرۆشیار): ئەم شێوازەی پڕوپاگەندە لە چاپووکی فرۆشیاری دەستگیرەوە وەرگیراوە کە دەلالی بەکەل و پەلەکەیدا هەلدەلێ. کە لەڕاستیدا پێکەوە شەریکە. هەومان شێواز لەلای راڵاه ە بەکرێگیراوەکان پەیڕەو دەکرێ.

**چواردەهەم:** شێوازی (بالۆنی تاقیکردنەوە): یان گرتنی نەبزی رای گشتی. لایەنێ هەڵدەستێ بە بڵاوکردنەوەی شایعەیەک دەربارەی کێشەیەکی دیاریکراو بۆ ئەوەی بزانێ کە رای گشتی تا چ رادەیەک وەڵامی دەداتەوە یان رەفزی دەکات، دوای ئەوە بەکردەوە هەڵسێ بە کارەکە.

**پانزەهەم:** شێوازی بێدەنگی : لە رێسا ناسراوەکان پروپاگەندە بریتییە لەوەی پروپاگەندە نابێ دژی خۆی بوەستێتەوە. کاتێ دوژمن بەیاننامەیەکی رەسمی دەرکردو ئەو هەڵەیەی پوچەڵ کردەوە کە کەوتۆتە پروپاگەندەوە لەم کاتەدا پێوستە ئەوەی پروپاگەندەکە دەکات بێدەنگ بێت. چونکە بەیاننامەکەی دوژمن دوای ماوەیەک لەبیردەچێتەوە بەڵام ئەگەر سەرەرای هەڵەکردنمان وەڵاممان دایەوە، ئەوکاتە دوژمن چەک و ئامرازێکی نوێی دەست دەکەوێ بۆ ناوزراندن.

گۆبلزی وەزیری پروپاگەندەی ئەڵمانیای نازی (٥٠٠٠٠) پەنجا هەزار فەرمانی بۆ رۆژنامەکانی ئەڵمانیا دەرکردووە کە چواریەکی بریتیبووە لە فەرماندان بە بێدەنگ بوون و وەڵام نەدانەوە.

## پێنجەم : جاووراو (الشائعة) :

*شایعە بڵاوکراوەی هەواڵێکی هەڵبەستراوە، کە هیچ بناغەیەکی لەواقعدا نییە. یاخود گێرانەوەی هەواڵێکە کەبەشێکی کەمی راستی تێدایەو بەئەنقەست تووشی تان و پۆ شکاندن و پیاهەڵدان و قەبەکردن دەبێت.* ئەمەش بەمەبەستی کارتێکردنی دەروونی لە رایگشتی بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی سیاسیو سەربازی و ئابوری.

شایعە زاراوەیەکە دەدردێتە پاڵ رایەکی بابەتی تایبەت و گونجاو بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی گوێیان لێدەبێت باوەری پێبکەن. ئەمەش لەرێگەی دەماودەم پێکردنەوە بڵاودەبێتەوە. بەبێئەوەی پێویستی بەبەڵگە هەبێت.

شایعە لەکاتی جوڵەکردنیدا بەشێوەی جیاجیاو بەتاسوخەوە دەگێردرێتەوە. کەواتە *شایعە خاوەنەکەی دیار نیەو کەس خۆی ناکات بە خاوەنی. چونکە درۆیەو ئەگەر بزانرێ هی کێیە رووزەردو شەرمەزار دەبێت ئامانجەکانیشی ناپێکێت.*

لەبەرئەوە دەبینین بۆ گێرانەوەو دەماو دەم پێکردنی شێوازی جۆراوجۆر بەکاردەهێنرێت، وەک دەڵێت: وتیان، هەندێ جار بۆ

سەرلێشێواندن و بۆنەوەی باوەڕی پێبکرێت کات و شوێنیشی تیا دیاریدەکرێت.
شایعە دژی زۆر شت دەکرێت: کەسێکی دیاریکراو، ڕووداوێ، فکرەیەک، پرۆژەیەک. واتە ئاراستەی ئامانجی جۆربەجۆر دەکرێت.
شایعە کە دەکرێت سوود لە نەزانی خەڵک دەربارەی ئەو ئامانجە وەردەگیرێت کە دژی دەکرێت.

## شایعە لە مێژوودا

هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی شایعەی لێنەبڕاوە چونکە مرۆڤ ئامادەیی قبوڵکردنی تێدایە. بەخوێندنەوەیەک و چاو پیاخشاندنێ بەمێژووی پێغەمبەران و ڕابەرە مەزنەکانی خوای گەورە ﷺ لەسەر زەوی سەیردەکەین جۆرەها شایعەیان دژکراوەو چەندەها درۆو بوختانیان بۆ هەڵبەستراوە بۆئەوەی خۆیان و پەیامەکەیان لەکەدار کەن و بەرگری لە بڵاوکردنەوەی بانگە ڕزگاریبەخشەکەیان بکەن.
شایعەو بوختان کردن بۆ یەکێ لەپاکترین ئافرەتانی مێژوو کە حەزرەتی (مەریەمە) بوو سەبارەت بە هاتنەدنیای حەزرەتی عیسا بێباوک. خۆ ئەگەر سەیری ژیانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بکەین ئەوا دەبینین هەر لەو ڕۆژەوە کەخوای گەورە ڕاگەیاندنی پەیامی ئیسلامی خستە سەرشان، تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد جۆرەها شایعەی بۆ هەڵبەستراوەو لەو ڕێگایەوەویستراوە ئازاری بدرێ و بەرهەڵستی بانگەوازەکەی بکرێت. *لێرەدا تەنها دوو نموونەی زەق و بەرچاو لەو شایعانە دەهێنینەوە کە لەدژی ئەو پێغەمبەرە مەزنەی خوا کراوە ﷺ.*

**یەکەم : ڕووداوی (افک)** : ئەو ڕووداوەی کە لە غەزوەی (بنی مصطلق)دا کاتێ خاتوو عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا لە سوپا دوادەکەوێو چاوەڕێی ئەوە دەکات بگەڕێنەوەبۆ لایو ببیەن بەڵام ناگەڕێنەوەو سەرەنجام هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری مەزن (صفوان) بەلایدا تێپەڕ دەبێت و دەیناسێتەوە کە ئەوە خاتوو عائیشەیەو لە کەژاوەکەیدا سواری وڵاخەکەی دەکات و دەیگەڕێنێتەوەو دەیگەیەنێتە سوپاکە.
دووڕووەکان کە هەمیشە لە بچوکترین دەرفەت دەگەڕان بۆ ئەوەی کەسایەتی پێغەمبەری خوای پێ لەکەدار بکەن و لەڕێی ئەم کارەشیانەوە

گورزێکی کاریگەر لە بیروباوەڕو بانگەوازەکە بوەشێنن، زۆر نامەردانە ئەمەیان قۆزتەوەو کردیان بە شایعەکە خاتوو عائیشە زینای لەگەڵ صفوان کردووە. بەداخەوە لەم کارەدا هەندێ موسڵمانی دڵ نەخۆشیش کەوتنە گەڵیان و باوەڕیان پێکردن (هەرچەندە کەم بوون). ئەم رووداوە دەتوانین بڵێین گەورەترین و سەختترین رووداوی ژیانی پێغەمبەر بوو. هاوەڵانی بەم ئازارەوە دەیانناڵاند شایعەکە ئەوەندە بەهێزو روخێنەر بوو، ئەوەندە گڵاوو کینە لەدڵانە بوو، کە ئەگەر فەزڵی خواو پتەوی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگای ئیسلامیی ئەو کاتەو گومان چاکێ بەیەکێ بردنیان نەبوایە، دوورنەبوو ببێتە هۆی زەبرێکی گەورە لە بانگەوازەکە، بەڵام دوژمنانی ئیسلام و ناحەزانی پێغەمبەرانی خوا لەوە بێئاگابوون کە خوای گەورە واز لە پێغەمبەرەکەی ناهێنێ، بەڵکو سەرەنجام ئەم شاڵاوە دڕندانەیە بەزیانی برەوپێدانی دەشکێتەوە. ئەوەبوو دوای مانگێ لەم رووداوەو دوای یەکێ مانگ لە ئازاری کۆمەڵی موسڵمان و چاوەڕوانی فریشتەئاسای عایشە بۆ فەرمانی ئاسمان خوای گەورە پاکیەتی عائیشەی دەرخست و پەردەی لەڕووی ناحەزانی هەڵماڵیو نەخشەو پیلانەکانی کردن بە بڵقی سەرئاو. ئەم رووداوە بەو تەوژمەیەوە تاقیکردنەوەیەکی گەورەبوو بۆ بڕواو متمانەی ئەندامانی کۆمەڵی موسڵمان لەو سەردەمەدا بەرامبەر رابەرو بەرنامەکەیان.. کە جگە لە چەند کەسێ بەپەنجەی دەست دەژمێردران هاوەڵە بەڕێزەکانیتر، بڕوایان بەم بوختانە نەکردو پشتی پێغەمبەرەکەیان ﷺ بەرنەدا و سەنگەری ئیسلامەکەیان چۆڵ نەکرد.

*لەم رووداوە چەندەها شت تێدەگەین :*

١) شایعەو هەوڵدان بۆ ناوزڕاندنی سەرکردایەتی کاری ئیسلامییو رابەرە گەورەکانی موسڵمانان لە درێژایی مێژوودا بەردەوام بووەو تەنانەت پێغەمبەرانی خوایشی لێنەبوێردراوە.

٢) ئەگەر شایعە دژی پێغەمبەری خوا کرابێ کە نموونەی پاکترین و کامڵ ترین مرۆڤی سەر ئەم زەمینە بووەو هەڵبژێردراوی خوای گەورە خۆی بووە، ئیتر بۆ دەبێ لامان سەیربێ کە ئەمڕۆ شایعە دژی کەسایەتییە ئیسلامییەکان و ڕێبەرانی کاری ئیسلامیی بکرێت؟.

٣) مەرج نییە هەر دوژمنانی ئاشکرای ئیسلام شایعە دژی ئیسلام و موسڵمانان بکەن بەڵکوزۆرجار موسڵمانە دڵ نەخۆش و تێنەگەیشتوو ستویلکەو ناحاڵیەکانیش بەخۆیان بزانن یا نەزانن دەبن بە مەقاشی

دەستی دوژمنـان و بەشداری لـە شـایعە هەڵبەسـتن دژی کۆمـەڵی ئیسـلامیی و پرۆژە ئیسـلامییەکە دەکـەن. ئەگـەر لـەناو هـاوەڵانی پێغەمبەردا کەسانی وا هەبووبن ئاوا بەئاسانی کەوتبنە ناو داوی پیلانی دوژمنانەوەو بەشداری ئەو تاوانە گەورەی مێژوویان کردبێ، ئیتر بۆچی دەبێ لامان سەیربێ کە ئەمڕۆش نەک هەر لە ناو گشتی موسڵماناندا بەڵکو هەندێ لەوانەش کە بەڕواڵـەت لەسـەر حاڵـەتی ئیسـلامی دەژمـێردرێن، بەشـداریی لـە شـایعەکردن دژی بزاڤـە بەرچاوڕوونـە ئیسلامییەیە رەسەنەکان بکەن؟.

٤) شایعە تاقیکردنەوەیەکی گەورەیە بۆ متمانەو باوەڕی هەرکۆمـەڵێ بـە رابـەرو رێبازەکـەیان. چونکـە شـایعە ئامـانجێکی بـۆ روخـاندنی ئـەو متمانەیە. ئا لەو کاتە تەنگانەدا و لەو تەم و مژەدا باوەڕی ئـەندامانی کۆمـەڵی ئیسـلامیی بەسـەرکردایەتی و رەوابوونـی هـەوڵ وتێکۆشـانیان دەردەکـەوێ، ئـەو کەسـەی بەهێرشـی شـایعەی دوژمنـانی ئیسـلام و موسڵمانانی ناحاڵی بڕوای بە لەرزە بکەوێ و بکەوێتە ژێر کاریگەریـەوە ئەوەهەر لە بنەڕەتا بڕواکەی بێقولاییو ریشەی دەروونییە.

٥) بەیەک ریزی موسڵمانان و گومانی چاک بردن بەیەک و متمانـەبوونیان، شـایعە زۆر ناخایـەنێ لـە رووهـەڵدەماڵرێو درۆو دەلەسـەبوونی دەردەکەوێو ئەوانەش کەبڵاویان کردۆتەوە سەرشۆڕو ریسوا دەبن.

**دووەم : شایعەی کوژرانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەجەنگی ئوحددا:**

یەکێکی تر لەو شایعانەی سـەربازگەی (شـرک) لـەکاتیخۆیدا لـەکاتی جـەنگی ئوحـددا بـوو، کـاتێ کـە شـایعەکەیان بڵاوکـردەوە کـە محمـد ﷺ کوژراوە وەک ئەوەی بەهاوەڵان بڵێن ئیتر ئەو کوژرابێ ئێوە خەریکی چـین؟ ئەم شایعەیەش کاری کردە سەر ورەی هەندێ لـە جـەنگاوەرە موسـڵمانەکان بەڵام لێزانینی پێغـەمبەری خواو خۆڕاگریو تێگەیشتویی بەشـێ لـە هاوەڵـە بـەڕێزەکان ئـەم شایعەیەشـی خسـتە چاڵـەوە. ئـەوەی لـەم شایعەیەشـدا بەدەردەکەوێ سەرکردایەتی ئیسلامی هەمیشەو لە زۆربەی جاردا ئامـانجی ئەم شاڵاوو شایعە بـۆ دروسـت کردنیانـە، چونکـە دوژمنـانی ئیسـلام چـاک دەرکی ئەوەیان کردووە سەرکردایەتی ئیسلامیی چ رێزو خۆشەویسـتییەک و قورساییەکی لە دڵ و دەروونی موسڵماناندا هەیـە. وە ئەگـەر هـاتوو ئـەمان توانیان ناوبانگی ئەو سەرکردایەتییە ناشـیرین بکـەن و کـارێکی وا بکـەن موسڵمانان باوەڕیان پێی لاواز بـێ، ئیـتر نەخشـەکانی ئـەمان سـەردەگرێو

ڕێگایان بۆ تەخت دەبێ و موسڵمانانیش بێسەرکردایەتی تووشی شکست و سەرشۆڕی دێن.

## مەرجەکانی شایعە

*شایعە دەبێت دوو مەرجی بەسەریەکەوە تێدا بێت کە ئەوانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:*

١) **بایەخ** : دەبێ شایعەکە بەنیسبەت ئەو ئامانجەی ئاراستەی دەکری و لەدژی بڵاودەکرێتەوە گرنگ و بایەخدار بێت، باس و خواسی رۆژبێت و خەڵکی حەزبکەن شتی دەربارە بزانن وببیستن چونکە ئەگەر شایعەکە جێگای گرنگیپێدانی شایعە لێکراوەکە نەبێ ئەوکاتە هیچ ئاکام و شوێنەوارێکی ئاشکرای نابێ. بۆ نموونە شایعەکردن دەربارەی بەرزبوونەوەی نرخی گۆشتی (بەراز) لەلایەن موسڵمانانی هەموو جیهانەوە جێگای بایەخ نییە چونکە لەئیسلامدا خواردنی گۆشتی بەراز حەرامە. بەڵام شایعە دەربارەی شاڵاوێکی چاوەڕوانکراوی دوژمن یان هەڵسانی ئاگری جەنگ و خوێن ڕێژی لەناو دوولایەنی نیشتمانیدا، ئەمانە جێگای بایەخی خەڵکین.

٢) **تەم و مژی و نادیاری** : تەنها ئەوەندە بەس نییە بابەتی شایعەکە جێی بایەخ بێت بەڵکو دەبێ ڕووداوو دەنگ و باسەکان ناڕۆشن و نادیاربن. چونکە ئەگەر خەڵکی حەیقەتی ڕووداوو هەواڵەکان بزانن ئیتر بڵاوکردنەوەی شایعەو کەوتنە ژێر کاریگەریەوە هیچ مانایەکی نامێنێ. *ئەم ناڕۆشنیەش بەهۆی چەندەها شتەوە دەبێ لەوانەش:*

ا- نەبوونی هەواڵ دەربارەی بابەتی شایعە دەربارەکراو.

ب- یان هەواڵەکان دەربارەی کورت و پچڕپچڕە.

ج- یان هەواڵەکان دژیەکن و هەواڵێ ئەویتر بەدرۆدەخاتەوە.

د- یاخود هەواڵەکان جێگای متمانەنین.

هـ- یان لەهەندێ گرژی و هەڵچوونەوە دێ کە وا دەکات تاک ئامادەی وەرگرتنی هەواڵ دەربارەی هەندێ ڕووداو نەبێ.

لەکاتی جەنگ دا ئەم دوو مەرجە هاتنەدیان ئاسانە. هەر لەبەرئەوەشە کاتی جەنگ کاتی زۆربوونی بڵاوبوونەوەی شایعەیە.

## له چ کاتێکدا شایعه زیاتر بلاّودەبێتەوە؟

*لەهەندێ کاتدا شایعە زیاتر بڵاودەبێتەوە لەوانەش:*

١) کاتی کارەسات و رووداوی گەورەی وەکو لافاو، بوومەلەرزە، بورکان، جەنگەکان، ....هتد.

٢) کاتێ هەواڵەکان ناڕۆشن و تەم و مژاوین.

٣) کاتێ کە خەڵکی متمانەیان بەسەرچاوەکانی هەواڵ و دەنگ و باس نامێنن.

٤) کاتێ پاشاگەردانی و بێشیرازەیی باڵ بەسەر وڵاتدا دەکێشێ.

٥) ئەو دەوروبەرە کۆمەڵایەتییەی بەناڕۆشنی و گومان و دوودڵیو بێمتمانەییو لێکهەڵوەشاوی دەناسرێتەوە ناوەندێکی لەباری بڵاوبوونەوەی شایعەیە.

٦) لەچەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆرەوە هەمان شایعە بڵاوببێتەوە.

٧) بەهێزی تابوری پێنجەم:[1]

تا زیاتر بەهێزبێت شایعەکەش زۆرتر بڵاودەبێتەوە، چونکە چەکێکی کاریگەری دەستی چاووڕاوو شایعەکردنە.

## کاریگەری شایعه

شایعە چەکێکی زۆر کاریگەرو ژەهراویو کوشندەیەو کاریگەریەکی خراپ بەسەر باری دەروونی تاک و کۆمەڵەوە بەجێدێڵێو دەورێکی چەواشەکردنی گەورەش دەگێڕێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ( وإذا جاءهم أمر من الأمن أو الخوف أذاعوا بە) شایعەکە گەشبینی بێت یان ڕەشبینی دەوری خۆی هەیە. زۆرجار بەهۆی شایعەوە ناتوانرێ هەڵویست جوان هەڵسەنگێنرێو هێزو لایەنێ یان دەدەوڵەتێ خۆی لەلا گەورە دەبێو زیاد لە پێویست لە شان و شەوکەتی دوژمنەکانی دادەبەزێنێ، (گۆبلز)ی وەزیری پروپاگەندەی ئەڵمانی نازی لەوتەیەکیدا دەربارەی کاریگەری شایعە دەڵێ:

(*فرێنێکی گاز چەند کەسێ دەکوژێ، بەڵام درۆیەک ملیۆنەها*)، شایعە زۆرجار وا لەدەوڵەت و هێزو لایەنێ دەکات حساب بۆ پێشهاتەکانی دواڕۆژ

---

[1] تابوری پێنجەم: بەهەموو ئەو هێزو لایەنانە دەوترێت کە بەرواڵەت نیشتمانین بەڵام لەراستیدا بۆ قازانجی دجوژمن دەست بەکارن.

ناکات و خۆی بۆ رووبەڕووبوونەوە ساز ناکاو پشتێنی لێدەکاتەوەو بێخەم پالی پێدەداتەوە، تا دوژمن غافڵ گیری دەکات و پرسەی لێدەبڕێت. لەولاوە لەڕێی شایعەی ترسەوە دوژمن دەیەوێ ورەی خەڵکی تێک بڕمێنێو رەشبین و نائومێدو بێمتمانەیان بکات و بڕوایان بە سەرکەوتن نەهێڵێو زۆرجار ئەم جۆرە شایعە زۆر بە توندو تیژی بڵاودەبێتەوەو کارێکی خراپ دەکاتە سەر خەڵکیو کەش و هەوایەکی پڕ لە دڵەڕاوکێو تۆقینیان بۆ دەخولقێنێ. شایعە رۆڵێکی گەورە دەبینێ لە دروست کردنی بێشیرازەیی‌و پاشاگەردانیو قولکردنەوەی گیانی دەمارگیریو وێرانکاری. بەو ئەندازەی پەروەردەی تاک و پەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمەڵیش لاواز بێت و نەزانیو دواکەوتوویی بالی بەسەر کۆمەڵدا کیشابێت مەترسی شایعەش زیاتر دەبێت.

ئێستا دەپرسین ئایا هەمووکەس بڕوای بە شایعە هەیەو هەر تاکێ بگری بڵاوی دەکاتەوەو دەیگێڕێتەوە؟

زۆربەی خەڵکی بڕوا بە شایعە دەکەن، تەنانەت ئەوانەش کە بڕوایان بەو شتانە نییە کەسانیتر دەیگێڕێتەوە.

شایعە بەزۆری بەشێوەی تشویقی بڵاودەکرێتەوە. چونکە ئەوانەی هەڵیدەبەستن و بڵاویدەکەنەوە ئەوپەڕی توانای خۆیان لە داڕشتنیدا بەکاردەهێنن. بۆ ئەوەی بەخێرایی بڵاوببێتەوەو بتەنێتەوە، بۆئەمەش سوود لەو هەست و نەستە دەروونیانەی وەکو ترس و گومان و ئاوات و زیندەخەوو شتی لەم جۆرە وەردەگرێت. ئەو شتانەی کەخەڵکی ناتوانن راستەوخۆو بەئاشکرا دەریبڕن. بۆ نموونە گریمان سەربازێ سەرکردەکەی خۆش ناوێ چونکە بڕوای وایە دڵڕەقانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و دادپەروەر نییە، ئەم سەربازە ناچێ راستەوخۆ کارێ لە دژی سەرکردەکەی بکات، هەروەها ناشیەوێ بەڕاشکاوی رای خۆی پێبڵێ، چونکە بەحوکمی پلەوپایەکەی ناتوانێت شتی لەم جۆرەی لەگەڵدا بکات. بەلام ئەگەر هات و رۆژێ ئەم سەربازە شایعەیەکی وای بیست کە ئەو سەرکردەی رقی لێیەتیو لێی دەترسێ سەرزەنشت کراوەو ئەگەری ئەوەش هەیە لێپرسراویەتیەکەی لێبسەنرێتەوە، بەبێ ئەوەی هەست بە تاوان بکات هەوڵ دەدات ئەم شایعە بێنێو بەرێ و بڵاوی‌بکاتەوەو خۆی وادادەنێ کە بەرامبەر ئەم چیرۆکە بەرپرسیار نییە چونکە ئەم تەنها قسەی خەڵکی تر دەڵێتەوەو هیچی تر.

بەلام لەلایەکی ترەوە گوێگرتنی لەم وشانەو گێڕنەوەیان بۆ ئەم و ئەو جۆرێ ئارامەندی دروونی بۆ پێکدەهێنێ.

ئاواتەخوازە کە ئەم هەواڵانە راست و دروست بن، چونکە پەیوەندی بە مەرۆیکی ناو قولایی دەروونی‌یەوە هەیە. لە ژیانی مەدەنیشدا ئەم شتانە زۆرە زەبەندەن. زۆرجار یەکێ شایعەیەک دەگێڕێتەوە باسی ئەوە دەکات لەلەراستیدا ئەم نازانێ ئەم قسانە راستن یان درۆ بەڵکو هەر ئەوەندە دەزانێ کە بەسەر دەمی خەڵکیەوەو ئەمیش دەیگێڕێتەوە. دیارە مرۆڤ بەم وشانە دەیەوێت خۆی لەهەست کردن بەبەرپرسیاریەتی لەبەرامبەر ئەم کارەی پێی هەڵدەستێ دەربازبکات.

هەر ئەمەیشە وای لێدەکات لەکاتی گێڕانەوەی قسەو باسەکەدا بەجۆرێ دەیڕازێنێتەوە بڕوای پێبکرێت. لەکاتی جەنگیشدا لەبەرئەوەی سانسۆری توند دەخرێتە سەر هەواڵ و دەنگ و باسەکانی لەمەڕ جەنگەکەو ترس و تۆقینێکی زۆریش لەئارادایە، لەبەرئەوە مرۆڤ زوو بڕوا بە شایعە دەکات و بلاویدەکاتەوە. پێویستە لێرەدا بوترێت بڕواکردن بە شایعە لەسەر تێڕوانینی تاک وەستاوە بەرامبەر بابەتی شایعەکەو پێویستیەکانی.

هەموو تاکێ پێویستی بە رێزلێگرتن و خۆشەلماندن و رازیبوون و رێزی کۆمەڵ بەرامبەری هەیە، سەیردەکەی یەکێ کە زیاتر بەلای فێڵ و ناپاکیدا دایدەشکێنێ زۆر زوو بڕوا بەو شایعانە دەکات کە لەو بارەیەوە بلاودەبنەوە.

لەلایەکی ترەوە هۆیەکی تر لەو هۆیانەی کە وادەکات مرۆڤ بەئاسانی بڕوا بە شایعە بکات ئەوەیە کە زۆربەی ئەو زانیاریانەی وەرمان گرتووە لەئەم و ئەوەوەیەو بۆیان گێڕاوینەوەو دەرفەتی‌ئەوەمان نەبووە پیایانا بچینەوەو دوای لیکۆڵینەوە وەریان بگرین.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی شایعە هەندێ لە پێداویستی‌یە شاراوەکانی ناخی مرۆڤ تێردەکات.

## پاڵنەرە سایکۆلۆجیەکانی شایعە دروست کردن

لەپشت شایعە دروستکردنەوە کۆمەڵێ پاڵنەری سایکۆلۆجی هەن کە پێویستە ئاماژەیان پێبکرێت:

١) **حەزکردن لە خۆدەرخستن :**

مرۆڤ زۆرجار بەگێڕانەوەی هەندێ هەواڵ و دەنگ و باس کە زۆربەشی زیادەڕەوی تێدایە بەڵکو هەندێجار درۆی شاخداریشی تێکەڵاوە، دەیەوێ خۆی وا نیشان بدات کە ئەم ئاگای لە هەندێ دەنگ و باسی دانسقە و نهێنی هەیەو لەهەندێ ناوەندی واوە نزیکە خەڵکی هەروا بەو ئاسانی‌یە دەستیان پێی ناگا، بێگومان مرۆڤێ بیەوێ لەم ڕێگایەوە بوونی‌و کەسایەتی خۆی بەخەڵکی بسەلمێنێ ئەوا مرۆڤێکی تێشکاوەو هەست بە کەم و کوڕی لەکەسایەتی خۆیدا دەکات و دەیەوێ بەم کارەی ئەو کەلەو کوڕەیان بشارێتەوە بەڵام لەڕاستیدا زیاتر لەڕووی هەڵدەماڵرێ‌و ڕیسوا دەبێت.

٢) **پەیداکردنی هاوسۆزی (التأیید العاطفي) :**

مرۆڤ بەسیفەتی مرۆڤ بوونی مەخلوقێکی ئاڵۆزەو لە قوڵایی دەروونیدا چەندەها (نزعات)ی دژبەیەکی تیایە لە: خۆشەویستی‌و ڕق لێبوونەوە، دڵەڕاوکێ‌و ئارامی، بەجەرگی‌و خۆبەدەستەوەدان، پەژارەو شادی‌و زۆر شتی‌تر کە مرۆڤ هەستی پێدەکات. دەبینی یەکێکمان ماوەیەکی دوورودرێژ دەربارەی شتێ دڵەڕاوکێ‌و پەرێشانی رووی تێدەکات بەبێ ئەوەی بزانێت ئەو شتە چی‌یە؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنمان گەورەیە هەندێجار بەرەفتاری منالانە هەڵدستین. دەترسین و دەچێژین و تووشی دڵەڕاوکێ دەبین بەبێ ئەوەی بزانین بۆ دەترسین و ئازار دەچێژین و دڵەڕاوکێمان تووش دەبێ؟

بەڵام شتێکی روون ئاشکرا هەیە کە ناهێلێ، ئێمە بەدرێژایی تەمەنمان بە ڕوونی هەستە ناوەکیەکانمان ببینین، هەست دەکەین کۆمەڵگا مافی بەسەرمانەوە هەیە هەوڵ دەدەین لەبەرچاوی دەوروبەرەکەمان لەخەڵکی بەرزتربین..

بەڵام زۆر شتی شاراوە لەناو ناخی دەروونماندا هەیە تەنانەت ناتوانین بۆخۆشمان دانیان پیدا بنێین لەبەرئەوەی تووشی شەرمەزاری دەبین. زۆرجار پەنا دەبەینە بەر خەیاڵ کردنەوە، یان زیادەڕەوی دەکەین لە دیاری‌کردنی ئەم هەستانە لای کەسانی‌تر. ئێمە وادەزانین ناتەواوی لەغەیری ئێمەدایە. بۆ نموونە: ئێمە نامانەوێ دان بە هەڵەکانماندا بنێین، لەبەرئەوە زۆرجار بەکاری توندوتیژ هەڵدەستین و هەڵدەستین بە تۆمەتبارکردنێکی بەرفراوان بۆ شاردنەوەی ئەم راستیە.

وەک ئەو جەردەو خوێن ڕێـژەی کـە پاسـاودانیکارە دڵڕەقـەکانی بـەوە دەکات دێ سـەرزەنشتی کۆمـەڵگا دەکـات بـەو بیـانووەی ئـەو تووشـی ئـەم چارەنووسـەی کردووە.

ئێمەی مرۆڤ نامانەوێ دان بەوەدا بنێین بیرتەسکین، ین دەمارگـیرین یاخود خۆپەرستین. ئەگەر دەرفەتێکمان بۆ بڕەخسێ ئەم تۆمەتانە ئاراستەی دوژمنەکانمان دەکەین، بۆ ئەوەیئەوە بشارینەوەکە بەرامبەر ئـەو کۆمەڵـە دەمارگیریمان تێدایە، هەروەها چـاو لـەو خۆپەرستیە دەپۆشـین کـە لـەناو ناخی خۆماندا هەیە.

بەڵێ ئێمە نامانەوێ دان بە کەم و کوڕییەکانماندا بنێین کاتێ دەست بۆ ئەم کەم و کوڕییانە لەکەسانی تردا رادەکێشین ئەو کاتـە جۆرێ لـەرێزو قەدەر بۆ خودی خۆمان بەدەست دەهێنین، زۆربـەمان لـە پاڵنـەرەکانمان - الدوافع- دەترسین یان هەست بە شەرمەزاری دەکـەین ئەگـەر بکەونـەڕوو، ئەمـەش وامان لێدەکات کەسانی تر بەلادەر لەقەڵەم بدەین.

زۆربەمان ئەم سیفەتە مرۆییـە سروشتیانە لەنەستماندا دەپارێزین و خۆ وا نیشان دەدەین کە ئەو سیفەتانەمان تیا نییە. لە هەستمانا تەنها ئەو شتانە وەردەگریـن رێزمـان لەبـەردەم خـەڵکا بپـارێزێ بـەڵام بەشـی دواوەو نەستمان دەیپارێزین و چوونە ژوورەوە بۆی قەدەغەیە.

ئەمەیە لێکدانەوەیەکی دروستی زۆربەی ئەو شایعەو درۆیانەی تـەعبیر لـە رق و کینـە دەدەنـەوە. بەتایبـەتی ئەوانـەی دژی گـەلی کـوردو بزاڤـە ئیسلامییەکانی دنیا دەکرێت.

تەنها راستیە دەرەکیەکان نییە وامان لێدەکات گومانی خراپ بـەرین و ناوبانگی کۆمـەڵێ لەکەدار کەین. بەڵکو ئـەو هەسـت و نەسـتەیە کـە لـە ژووری دواوەی عـەقڵماندا بـەندمان کـردووە. لـەرێی ئـەم ژوورانـەو ئـەم خانانەوە شایعەکانی تایبـەت بـە کـەم و کـوڕی کەسـانی تـرو بەدرەوشتیان دەردەچێ.

سوود لە ترس و بیم و هەستکردنمان بـە نائارامی وەردەگرێ. بـەڵام هەمیشـە دەمانـەوێ لەبەشیپێشـەوەی عـەقڵمان دووریخەینـەوە. هـەر لەخۆمانەوە هەمیشە ئەوە رەت دەکەینەوە دان بەم خاڵە لاوازەدا بنێین.

لەباتی ئەمە بڕوا بەو شتانە دەکەین کە شایعەچیەکانیتر دەیڵێن، ئـەم هەست و نەستانەی لەبەشی دواوەی عـەقڵمان بـەندمان کـردوون وەنـەبێ

بھانکوژین. بەڵکو خواردنی دەدەینێ ئەمەش بەپێدانی شایەعەو زۆربڵێیی‌و شتی لەم جۆرە.

کاتێکیش ھەستمان بەم پاڵنەرانە کرد ترس دڵ و دەروونمان دادەگرێ لەو کاتەدا ئەگەڕێین بەدوای (قۆچی قوربانی) (کبش الفداء)دا تا جامی تووڕەیی خۆمانی بەسەردا بڕێژین.

*لێرەدا چاک وایە ئاماژە بە ئامانجێکی تریش بکەین کە شایعە بەدی دێنێ هێرش کردنە سەر ئەو شتەی مرۆڤ رقی لێیەتی دڵی دەداتەوە هەروەها خزمەتێکی تریش دەکات ئەویش پاساودانی هەستی مرۆڤەکەیە بەرامبەر ئەو هەڵویستە.*

بۆ نموونە ئافرەتێ کە شووی نەکردووەو چۆتە تەمەنەوە بەخۆی دەڵێ (ئایا من لەو خانمە باشتر نیم کە ئارام و ئاسوودە لەگەڵ ماڵ و میردی خۆیدا دەژی؟).

پوختەی قسان ئەوەیە شایعە لەباریدایەتی لە توندی گرژی عاتیفی کەم کاتەوە بەو سیفەتەی کەلەبەرێکی هەناسەدان و دەروولێ‌کرانەوەیە بوونی ئەم عاتیفانە پاساو دەداو دەیپارێزێ کە ئەگەر خاوەنەکەی بەرەو رووی بێتەوە لەلای مەقبوڵ نییە.

بەم رەنگە زۆرجار شایعە وا لە مرۆڤ دەکات هەست بکات کە لە دەوروبەرەکەی تێگەیشتووە.

٣- رەنگدانەوە ( الإنعکاس )

کاتێ باری دەروونی‌و عاتفی مرۆڤ بەبێ‌ئەوەی پێ‌بزانێ لە لێکدانەوەی دەوروبەرەکەیدا رەنگی‌دایەوە. ئەوە پێی دەوترێ رەنگدانەوە، ناتوانێ بەڵگەی بابەتی بۆ لێکدانەوەی راستیەکانی دەوروبەری بێنێتەوە. شایعە جۆرێکە لە زرەخەو کاتێ ئەو چیرۆکەی گوێ‌بیستی دەبین و ئەو راستیەمان بۆ لێک دەداتەوە کە رێکی ژیانی ناوەوەمانە دڵمان دەیگرێت و بڕوای پێ‌دەکەین. ئەوەی بۆ خەڵکی بەهەڵە دەزانین بۆ ئێمە ئەزموون و تاقی‌کردنەوەیە، کەسانی‌تر هەڵەدەکەن بەڵام ئێمە هەڵە ناکەین تەنانەت ئەگەر هەڵەشمان کرد ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ هی کەسانی‌تر زۆر سادەیە. بەهۆی بڕواکردن بە شایعە مرۆڤ دەیەوێ لەسزای ویژدان خۆی رزگاربکات، کاتێ بڕوامان وابوو کەسانی تر هەڵەن، هەوڵدەدەین لە هەستکردن بەتاوان و سزای ویژدان رزگارمان ببێ، بەڵام هەرکاتێ لۆمەی خۆمانمان کرد ئەو کاتە زۆرکەم باوەڕ بە شایعە دەکەین. ئەوانەی ناتوانن

رووبەڕووی هەڵەکانیان ببنەوە لە (قۆچی قوربانی دەگەڕێن). بەڵام ئەوەی لاوازیەکە لەخۆیاندا دەبینن هەوڵی ئەوە نادەن، ئەم لێکدانەوە پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان شایعە ئەو باری عاتیفیەمان بۆ روون دەکاتەوە. کە زۆرجار بە توندی بەچێرۆکی شایعەکەوە بەستراوەتەوە بەجۆرێ ئێمە شایعەمان بەرەنگدانەوەی باری عاتیفی خودی خۆمان دانا.

٤- رق و کینە

زۆرجارمرۆڤ بەپاڵنەری رق بوونەوە لەنەیاران و ناحەزانی خۆی هەوڵ ئەدا لەرێی شایعە بۆ هەڵبەستن و لێکدانەوەی رەفتاریان بەو جۆرەی خزمەتی ئامانجەکانی خۆی دەکات تێکیان بشکێنێ. لەلایەکی ترەوە لەرێی ئەم شایعەوە دەیەوێ عەدالەتی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر ناحەزەکانی بۆ خەڵکی روون بکاتەوە. ئەوە ئەوانن وادەکەن و فلان شت دەڵێن و پیاوی فلان لایەنن و .. هتد.

مرۆڤ بەشایعە سەردەکەوێ بەسەر کۆمەڵە خەڵکیدا کە ئەگەر رووبەڕوویان بێتەوە هیچی پێ‌لەگەڵ ناکرێن، زۆربەی ئەو شایعانەی دژی ئیسلامیەکان دەکرێ لەم جۆرەیە بۆ ناوزڕاندن و دوورخستنەوەی‌خەڵکی لێیان و دابڕینیانە لە جەماوەر.

## لە پاڵنەرەکانی تری شایعە

*بەدەر لەو خاڵانەی باسمان کرد هەندێ پاڵنەری تریش لەم مەسەلەیەدا دەور دەبینن وەک:*

ا سووربوونی مرۆڤ لەسەر لێکدانەوەی رووداوەکان تەنانەت ئەگەر زانیاری تەواویشی لەم بارەیەوە لەبەردەستدا نەبێت، کاتێ زانیاریەکانیشی ناتوانێت. چوارچێوەیەکی ئاشکراو روونی رووداوەکان پێک بهێنێ. ئەوسا بۆ تەواوکردنی سیماو ئادگاری رووداوەکان پەنا وەبەر ئەندێشەو خەیاڵکرنەوە دەبات .

ب هەڵەشەییو پەلەکردنی مرۆڤ لە کاروبارەکانیداو لەبەردەست نەبوونی کاتی تەواو بۆ گەڕان بە دوای راستیەکاندا. ئەمە وای لێ‌دەکات پەنا بەرێتە بەر شایعەو چاوڕاو.

م هەندێ‌جار شایعە جۆرێکە لە رازیکردنی دەروونی کە مرۆڤ ناتوانێت بەشکست خواردوویی رووبەڕووی بێتەوە. مرۆڤ ناتوانێت بچێتە مەیدانی بازرگانیو سەرکەوتنێکی بەرچاو بەدەست بهێنێ لەبەرئەوە

بەدەست ئەنقەست درۆو دەلەسە بۆ ئەو کەسانە هەڵدەبەستێ کەلەو مەیدانەدا کاردەکەن. وەک ئەوەی دەڵێ: کارەکانیان هەمووی لەسەر فڕوفێڵ و ناپاکیو سوێندی درۆ بەندە. ئەم حاڵەی من زۆر چاکترە کە ناچم لەسەر حسابی کەسایەتی و بیروباوەڕو ئابڕووی خۆم کاری وا بکەم، نموونەیەکی تر ئەو قوتابییانەیە کە لەتاقیکردنەوەکاندا سەرناکەون، کە زۆرجار هاوڕێ قوتابیەکانیان و مامۆستاکانیان بەپیلان لێگێڕان و خیانەت کردن و شتی لەم جۆرە تاوانبار دەکەن، دەڵێن ئەگەر وانەمان پێبوترایەتەوە ئێمەش لە قوتابییە یەکەمەکان دەبووین.

هەموو ئەم هەوڵانە بۆ ئەوەیە مرۆڤی خودی رازی بکات و هەست بەڕیسواییو شەرمەزاری نەکات.

بە کورتی ئەو پاڵنەرانەی وا لە مرۆڤ دەکات هەڵسێ شایعە بکات زۆرن و ئەوەتەنها گرنگترینیان بوو. ئەشێ زۆرجار چەند پاڵنەرێک لەیەک کاتدا لە دروستکردنی شایعەیەکدا بەشداربێ.

## جۆرەکانی شایعە

شایعە لەسەر بناغەی جۆراوجۆر پۆلێن دەکرێت.

**یەکەم : بەگوێرەی پاڵنەرە سایکۆلۆجیەکان :**

لەم رووەوە دەکرێ بە سێ جۆرەوە:

١- **شایعەی ترس:** مەبەست لەم جۆرە شایعەیە نانەوەی ترس و دڵەڕاوکێیە لە دڵ و دەروونی خەڵکیدا، وەک ئەو شایعەی ئەڵمانەکان لەجەنگی دووەمی جیهانیدا بڵاویان کردەوە گوایە گەلەکەشتی ئەڵمانەکان ئەلەکەشتی هاوپەیمانەکانی تێکشکاندووەو ئینگلتەرەش بەهوی ئەو گەمارۆ ئابورییەی بەسەریدا سەپێنراوە خۆبەدەستەوە دەدات. یاخود شایعە لەبارەی بڵاوبونەوەی خۆراکی ژەهراوییان نەخۆشیەکی پەتای کوشندە یان هەڵگیرسانی شەڕێکی خویناویو...هتد.

٢- **شایعەی ئومێد :**

بەهەموو ئەو شایعانە دەوترێ کە بەمەبەستی ئەومێدنانەبەرو لێکردنەوەو بێخەم بوون بڵاودەکرێتەوە، یاخود بەپێچەوانەی پێشوو باسی سەرکەوتن دەکات.

٣- **کینەو دووبەرەکی:** هەموو ئەو شایعانە دەگرێتەوە کە ئامانج تیایدا بڵاوکردنەوەی گیانی دووبەرەکیو رق و کینەیە لەناو چین و توێژە

جۆربەجۆرەکانی خەڵکدا یان حیزب و گروپ و دەوڵەتاندا ئێستا بۆ ئەوەی دوژمن سوود لەو ناکۆکیانە وەرگرێت کە بەو جۆرە دروستیان دەکات.

**دووەم : بەگوێرەی خێرایی بڵاوبوونەوەی**

شایعە بەگوێرەی خێرایی بڵاوبونەوەی دەکرێ بە سێبەشەوە:

١) **خشۆک** : بەو شایعانە دەوترێ کە لەسەرخۆو هێواش بڵاودەبنەوە تا وردە وردە هەموو کۆمەڵگا دەگرێتەوە.

٢) **خێرا یان توندو تیژ** : بەو شایعانە دەوترێ کە وەک ئاگر بەردەبێتە پاوان زۆر بەخێرایی بڵاودەبێتەوەو کۆمەڵگا دەگرێتەوە.

٣) **رۆچوو** : هەموو ئەو شایعانە دەگرێتەوە کە بڵاودەکرێتەوەو دوایی گوم دەبن و هەرئەوەندە دەزانی لەبارودۆخێکی هاوچەشنی تردا سەر هەڵدەدەنەوە.

## ئامانجەکانی شایعە

دیارە شایعە لەکاتی شەڕو ئاشتیدا ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا بەگشتیو بەسەریەکەوە باسی دەکەین و لەگرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن :

١- **بەکارهێنانی بەمەبەستی دووبەرەکی نانەوە**، بۆ لێکترازانی ریزەکان وپەرتەوازەکردن و پەرت کردنی دوژمن، ئەویش بەیەکێ لەم سێ شێوە دەبێ:

ا- نانەوەی دووبەرەکیو ناکۆکی لەناو ریزەکانی دوژمندا.

ب- ناکۆکینانەوە لەنێوان دوژمن و هاوپەیمانەکانیو وازهێنانیان لە یارمەتیدانی.

ج- بێلایەن کردنی هێزەکانی ترو بێبەش کردنی دوژمن لەوەی ببێ بە هاوپەیمانیان.

٢- **بەکارهێنانی بەمەبەستی چەڕەدوکەڵ دروستکردن لە دەوری رووداوێک** و رووپۆشکردنی بۆ شاردنەوەی راستیو هەواڵی دروست. دەکرێ بەلێشاو شایعە بڵاوبکرێتەوە لەناو ئەوانیشدا هەندێ زانیاری راست و دروست هەبێ، ئیتر ئەو کاتە دوژمن سەری لێدەشێوێو وادەزانێ ئەو زانیاریانەش هەر بەشێکە لەو شەپۆلە شایعەی رووبەڕووی بۆتەوە. بەم شێوەیە زۆر زەحمەتە

بەرامبەری بتوانێ نهێنییە راستەقینەکان و هەواڵە راستەکان لە هەواڵە درۆکان جیابکاتەوە.

٣- **تێکشکانی هۆیەکانی راگەیاندنی دوژمن**، بۆ نموونە ئەو شایعەی ئەڵمانەکان لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا بلاویان کردەوەو رایانگەیاند فرۆکەکانی ئینگلتەرە توانیویانە هێلی شەمەندەفەری بەرلین تێک بشکێنن، بەجۆرێ ئینگلیزەکان بروایان کردو هەواڵەکەیان لەرادیۆ بلاوکردەوە. دوای ئەوە ئەڵمانەکان رۆژنامەنووسەکانی جیهانیان بانگ کرد بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بزانن هێڵەکە هیچی لێنەهاتووەو رادیۆی بی بی سی درۆی کردووە.

٤- **بەکارهێنانی شایعە بۆ درکاندنی ئەو هەواڵ و زانیاریانەی کە دوژمن دەیشارێتەوە.** بۆ نموونە لەجەنگی جیهانی دووەمدا کاتێ یابانیەکان شالاویان بردە سەرهێزێکی ئەمریکی زۆر مەبەستیان بوو حەقیقەتی زیانەکانی ئەمریکا بزانن، کەوتنە شایعە دروست کردن بەجۆرێ خەریک بوو ورەی گەلی ئەمریکی بروخێنن و ئەمریکایان ناچارکرد راستی زیانەکان بدرکێنێت.

لێرەدا دەوری سەرکردەی بەتواناو گەل و ئەندامانی هوشیار دەردەکەوێ کەکارێ نەکەن دوژمن لەم رێگایەوە زانیاریە نهێنییەکانیان لێ دەرکێشێ.

٥- گومان دروست کردن بۆ دوژمن سەبارەت بە ناعادیلانەبوونی ئەو ئامانجەی لەپێناویدا هەوڵ دەدات یان بۆی دەجەنگێ.

٦- **متمانە نەهێشتنی دوژمن بە هێزەکانی** لە رووی پیاوو سەرکردەو چەک و جبەخانەوە، هەروەها بڕواپێهێنانی کە هەوڵدانی بێسوودەو گەیشتنی بەسەرکەوتن کارێکی زۆر دوورو ئەستەمە.

٧- **ترس و تۆقین خستنە دڵی دوژمنەوە** و ورە رووخاندنی. (جەنگیزخان) هەمیشە لەپێش ئەوەی سوپاکەی شالاوبەرێتە سەر ناوچەیەک لەرێی کاروانچیەکانەوە شایعەی دەربارەی زەبروزەنگ و سامناکیی سوپاکەی بلاودەکردەوە، تا لەم رێگەیەوە ورەو گیانی بەرهەڵستی دوژمنەکانی تێک بشکێنێ.

٨- **هەوگدان بۆ بلاوکردنەوەی بێمتمانەیی لەنێوان سەرکردایەتیو بنکە جەماوەریەکەیدا**، ئەمە یەکێ لە بنچینەییترین ئامانجەکانی شایعەیە.

بەگشتی شایعە دەیەوێ کەش و هەوایەکی ئالودە بە رق وکینەوە دووبەرەکی‌و بێ‌شیرازەیی لەناو کۆمەڵگادا بلاوبکاتەوەو ناوبانگی چاکەخوازان لەکەدار بکات و پەکی بزوتنەوەی ئیصلاح و چاکەخوازی بخات و سەر لە رای گشتی بشێوێنێ‌و چەواشەی بکات. ئەمڕۆ چەکی شایعە بەوپەڕی نامەردی دژی سەرکردایەتی هێزە ئیسلامی‌و نیشتمانیە دلسۆزەکان بەکاردەهێنرێت و ناحەزان لەهەوڵی ئەوەدان بەهەر نرخێ بووە ئەم جموجوڵە رزگاری‌بەخشە قۆناغە سروشتی‌یەکانی خۆی وەک پێویست نەبڕێ‌و ناشیرین بکرێ و متمانەی ئەندامەکانی کەم بکرێتەوەو بەناهەق تۆمەتی ناڕەوای بدرێتە پاڵ.

## بەرهەڵستی‌کردنی شایعە

دوای ئەوەی مەترسی شایعەمان زانی ئێستا پێویستە بزانین چۆن و بە چ شێوەیەک خۆمانی لێ‌بپارێزین؟

دەشێ وابزانرێ هەر ئەوەندەی زانیاریمان لابوو ئیتر شایعە لەئارادا نامێنێ. بەڵام مەرج نیە، چونکە زۆرجار سەرەڕای بوونی زانیاری راست و دروست کەچی شایعە هەردەکرێ‌و بلاودەبێتەوە. چونکە تەنها زانیاری‌و لێکۆڵینەوە بەس نین بۆ لەناوبردنی ئەو شایعانەی لە ترس و رق و کینەوە سەرچاوە دەگرن.

ئەم شایعانە پاڵنەرەکەی لە دەروونی ئەوانەدایە بلاوی‌دەکەنەوە هەروا بەئاسانی دەرناکیشرێت. دەبێ تێگەیشتنێکی هەمەلایەنەمان دەربارەی بابەتی شایعەکە هەبێ. *بۆ بەرهەڵستی‌کردنی شایعەو رێگرتن لە بلاوبونەوەشی پەیڕەوی کردن لەم خالانەی خوارەوە پێویستە:*

١) **گومانی چاک بەیەک بردن**، کاتێ ئێمە گومانی چاکمان بەیەک بردو بەرامبەر بەیەکتری بەدگومان نەبووین ئەو کاتە شایعە ناتوانێ کارمان تێ‌بکات، دیارە مەبەست لە گومانی چاکی ئەندامانی کۆمەڵی باوەڕدارو دلسۆزی گەل و ولاتە بەیەکتری تا رێگا لە دوژمن بگرن لەرێی شایعە بلاوکردنەوە لە ریزەکانیاندا مەرامەکانی بەدی نەهێنێ، چونکە بەرامبەر دوژمنانی بیروباوەڕو خاک و نەتەوە دەبێ هوشیاربین و خۆش باوەڕ نەبین. (لولا إذ سمعتموه ظن المؤمنون والمؤمنات بأنفسهم خيرا وقالوا هذا إفك مبين)

وانه: هەرئەوەندەی گوێبیستی شایعەکەی (افک) بوون بڕواداران ژن و پیاو گومانی چاکیان بە خۆیان بردو هەموو لایەک وتیان ئەمە شایعەو درۆو دەلەسەیەکی ناشکرایەو هیچ بناغەیەکی راست و دروستی نی‌یە.

٢) **بلاوکردنەوەو دەماو دەم پێنەکردنی**، خوای گەورە دەفەرموێت (لولا إذ سمعتموه قلتم مايكون لنا أن نتكلم بهذا سبحانك هذا بهتان عظيم)

خوای گەورە لەئایەتێکی تری سورەتی (النساء)دات باسی ئەوەی بۆ کردووین و لەسەرئەوە پەروەردەمان دەکات کە هەر لەخۆمانەوەو دوور لە گیانی بەرپرسیاریەتی هەواڵ و دەنگ و باس و وتی وتی نەهێنین و نەبەین بەڵکو بیگەیەنین بەدەزگا بەرپرسەکان و لێپرسراوان و لەرێی ئەوانەوە جۆری مامەڵەکردن لەگەڵ هەواڵەکە دیاری بکرێن. کۆمەڵێ ئاوا پێگەیشتوو ئاوا جولایەوە، دەبێتە شورایەکی بەهێز لەبەردەم شالاوی شایعەو چاوڕاوی ناحەزانی کینە لەدڵ، ژیانی شایعە وا لە دەماو دەم پێ‌کردنیا کە باس نەکرا دەمرێ.

٣) **زمان گرتن**، وەک هەموومان دەزانین کە لەئیسلامدا هەموو دەم هەڵهێنانەوەو وتەیەک بەرپرسیارێتیەو لەرۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەرە هەر بۆیە زمان گرتن و قسە فڕێ‌نەدان رەوشتێکی رەسەن و بەرزی ئیسلامی‌یە بەڵکو داواکاری‌یەکی شەرعی‌یە.

(والذين هم عن اللغو معرضون) مرۆڤی باوەڕدار خۆی لە وتەو قسەی بێ‌سەروبەرە دەپارێزێو توخنی ناکەوێ.

(وإذا مروا باللغو مروا كراما) کاتێ باوەڕداران ئەدەن بەلای ئەو کۆڕو کەسانەی خەریکی کاری بێ‌هودەو چەواشەکردنن پارێزگاری لە کەسایەتی‌و پلەی بەرزی خۆیان دەکەن لابەلای ئەو شتانەداناکەنەوە. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ:

(كفى بالمرء كذبا أن يحدث بكل ما سمع)

مرۆڤ ئەوەندە تاوانەی بەسە کە هەرچی بیست بێ سێ‌و دوو لێ‌کردن باسی بکات و بیگێڕێتەوە. ئەم چارەسەرو پەروەردەیی‌و کۆمەلایەتیە پێویستە هەموو چین و توێژەکان بگرێتەوە تا ببن بە بەشێ لەبەرهەڵست کردنی جەنگی دەروونی‌و لەوانەش چەکێکی ئەو جەنگە کە شایعەیە.

٤) **دروستکردنی عەقلیەتێکی ئیسلامی زانستی و لێدان لەفکری** ئەفسانەیی‌و سلبی‌و ڕاڕا چونکە شایعە لەئەفسانەوە نزیکە بۆیە

عەقلیەتێکی پەروەردەبووی ئیسلامی زۆر زەحمەتە وەری بگرێت و باوەڕی پێ بکات.

٥) **رواندنی تۆوی هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی لە ناخ و ویژدانی ئەندامانی کۆمەڵدا.**

٦) **بەهێزکردن و گەشەپێدانی هوشیاری سیاسیو ئیسلامی و ئاگایی** پەیداکردنی جەماوەر لە بنەماو شێوازو چەکەکانی جەنگی دەروونی بەگشتیو شایعە بەتایبەتی.

٧) **هەوڵدان بۆ دابین کردنی ئارامی دەروونی بۆئەندامان و** قەلاچۆکردنی بێکاریو دەست بەتاڵی، هەروەها نەهێشتنی بێزاریو پەستیو خەمۆکی کەکێڵگەی میکرۆبی ئەم دەردە کوشندەن.

٨) **متمانە بەسەرکردایەتی**، شالاوی شایعە بۆ سەرکردایەتیوسەرکردە رەمزەکان تا بڵێی بەهێزە تاجەماوەر وازیان لێبێنن و پشتیان بەرنەدەن و دەوریان چۆڵ کەن و نەخشەیان لێتێکدەن بەتایبەتی شەرکردایەتی کاری ئیسلامیو سەرکردە نیشتمانپەروەرە راستەقینەکان لەکۆن و نوێدا هەمیشە بونەتە ئامانجیشالاوی شایعەو ئاوزڕاندن، بەلام بەبونمان لەسەر شڵتۆو پشتگیریکردنی رابەرە دڵسۆزەکانمان نەخشەی دوژمنان دەبێت بە بڵقی سەرئاو.

٩) **بەتوندی رووبەڕووی ئەو کەسانە بوەستینەوە کەخەریکی بڵاوکردنەوەی شایعەن** و هەست بە هیچ بەرپرسیاریەتێکی ئیسلامیی ناکەن.

١٠) **بڵاوکردنەوەی راستیەکان و بەئاگاهێنانەوەی جەماوەر** لە ئاقار راستی هەواڵ و رووداوەکان و نەهێشتنی تەم و مژو نادیاری بەسەریانەوە.

بەم شێوەیە عەقلیەتێکی ئیسلامیو هوشیاری سیاسیو پابەند بوون بە ئاراستەکردنە ئیسلامییەکان لەم رووەوە بە متمانەی بێئەندازەمان بەرێبەرایەتیو رێبازو ئامانج و دروشمان بەخۆگریو خۆناسین و دوژمن ناسیمان بەجدیەت و قوڵ لێهەڵمالین و پشتی یەک گرتن. بەگەشەپێدانی گیانی بەرپرسیاریەتیو ناسینی ئەرکی سەرشان و سروشتی ناحەزان نەک هەر سنورێ بۆشالاوی شایعە دادەنێین بەڵکو برەوپێدەرانیشی ریسواو شەرمەزار دەکەین یان ئەگەر شایانی وەبەرهۆش هاتنەوە بوون رایان دەچڵەکێنن و لە زەلکاوی ئەم خیانەتە دەریان دەهێنن و رزگاریان دەکەین.

*لەکاتی رەتدانەوەی شایعەو پوچەڵ کردنەوەیدا لەرێی دام و دەزگاکانی راگەیاندن و جەماوەرەوە دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرین.*

١) رەتدانەوەکەدەست بەجێو سەرپێی نەبێ. بەڵکو دوای ئەوەی دەخرێتە بەردەم شارەزایان ئەو کاتە پوچەڵ بکرێتەوە.

٢) پێویستە رەتدانەوەکە مەنتقی بێو رووداوو ئامار پشتگیری بکات، چونکە رەتدانەوەیەکی لاواز کە راستیەکان پشتی نەگرێت. متمانە دەروخێنێو هەیبەتی دەزگا رەتدەرەوەکەش کەم دەکاتەوە.

٣) زیادەرەوی لە نکولی‌کردنی تەواوی رووداوەکەنەکرێت، چونکە زۆربەی شایعەکان تاهەندێ راستی تیایە پێویستە ئەوهەندە باس بکرێ ئەو کاتە متمانە زیاتر دەکات.

٤) نابێ هەمووشایعەیەک بدرێتە پاڵ دوژمن چونکە ئەو کاتە دوژمن لەبەرچاوی جەماوەرگەورە دەبێو وادەزانن دەزگا رەتدەرەوەکە هەرچی گیروگرفت هەیە ئەیسوێ بەسەری ئەودا.

٥) پێویستە سەرەتاو کۆتایی رەتدانەوەکە نکولی لێ‌کردن لە شایعەکەی تیابێ. بۆئەوەی بیروهۆشی بۆ ئامادەبکرێت. بەڵام هەروا لە بیرو پێشەکێ شایعەکە بخەیتەروو نەو کاتە دەنوسێ بەبیرهۆشەوە.

٦) لابردنی دەستەواژە بنەرەتیەکەی شایعە. چونکە شایعە بەعیبارەتە بنەرەتیەکانەوە سەرنج راکێش و کاریگەرە. لە پۆشاکە بنەرەتیەکەی خۆیدا ناخرێتەروو، بەڵکو ساناو کێشەکە لە پۆشاکێکی شرو وردا دەخرێتەروو. چونکە شایعە زۆر هەولی لەگەڵ دەدرێ تا بە جوانترین وشەو قەشەنگترین پۆشاک رووپۆش بکرێت و کاریگەربێت.

٧) فەرامۆش کردنی شایعە سستەکان، هەموو شایعەیەک شایستەی رەتدانەوە نی‌یەو سەرقاڵ نەکردنی جەماوەر لەرەتدانەوەی ئەو جۆرە شایعانە باشترە.

٨) لەبنەرەتدا بابەتی بین، رەتدانەوەکە نەکرێ بە دەرفەت بۆ خستنەرووی باری سەرنجی تایبەت و لەبابەتی بوون دەرچێت.

٩) رەتدانەوەی جدی بێو وانەزانرێ شتەکە تەنها بۆ کات بەسەربردن و پێکەنینە لەگەڵ بەئاگابوون لەو مەترسیەی لەخۆی گرتووە.

١٠) هۆشیاری لە ڕەتدانەوەدا، بۆ ئەوەی کارێ نەکەین لەباتی ئەوەی شایعە ڕەتدەینەوە زیاتر بڵاویبکەینەوە.

*دەبێ دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەمیشە ئەوە بیر جەماوەر بهێننەوە کە*

١- شایعە درۆیە، بێباوەڕانیش خەریکی درۆ هەڵبەستنن.
٢- شایعە گومانە، گومانیش درۆترین قسەیە.
٣- شایعە وەهم و چاوبەستێکیو گومڕاکردن و سەرلێتێکدانە.
٤- مرۆڤی عاقڵ ئاوڕ بەلای شایعەدا ناداتەوە، چونکە دەزانێ هی ئەوەنییە متمانەی پێبکرێت.
٥- شایعە چەکێکە لەچەکەکانی دوژمن.
٦- شایعە ورە دەڕوخێنێو ئەوەی بڵاوی دەکاتەوە خائینە.
٧- شایعە چەکی دەستی ترسنۆک و حەسوودو دووڕووەکانە، لەو شوێنانەش کە بەرپرسانی بەچاکی دەزانن بە تایبەتی لەکاتی جەنگ و بەرەو ڕووبوونەوەدا بە بڵاوکردنەوەی دژە شایعە بەرگری لە شاڵاوی شایعەی دوژمن بگیرێت.

## هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی شایعە لەناو ریزی موسڵماناندا

*هەڵوێستی ئیسلام لەم ڕووەوە لەچەند خاڵێکدا دەخەینەڕوو:*

**یەکەم: هەڵبەستنی شایعە:**

١- **ئیسلام لەڕێی قەدەغەکردنی ئەو شتانەی کە شایعە بڵاودەکاتەوەو دەبێتە هۆی هاتنەکایەوەی هەڵبەستنی شایەعەی قەدەغەکردووە،** *ئەمەش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:*

ا) چونکە *شایعە درۆیەو ئیسلامیش بەگشتی دژایەتی درۆدەکات و* قەدەغەی دەکات. لەم بارەوە دەق زۆرە لێرەدا تەنها ئاماژە بەم ئایەتە دەکەین کە دەفەرموێ: (إنما يفتري الكذب الذين لايؤمنون بآيات الله وأولئك هم الكاذبون) النحل/١٠٥.

لێرەدا درۆکردن دراوەتە پاڵ بێباوەڕان و ئەوانەی باوەڕ بە بەڵگەو نیشانەکانی خوای گەورە ناهێنن.

ب) لەبەرئەوەی ئازاری تیایە بۆ ئەو کەسەی بۆی دانراوە یان بۆی دەگوێزرێتەوە، ئازاردانیش حەرامە. خوای گەورە دەفەرموێ:
(والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير مااكتسبوا فقد احتملوا بهتانا وإثما مبينا) الأحزاب/٥٨.

واتە: ئەوانەی کە پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار ئازاردەدەن، بەبێ ئەوەی شتێکی وایان کردبێت پاساوی ئەم ئازاردانەیداتەوە، ئەوا بوختان و تاوانێکی ئاشکرایان خستۆتە کۆڵی خۆیان.

فەرمودەش دەفەرموێ: (إن دماءكم وأعراضكم وأموالكم عليكم حرام). - رواه البخاري ومسلم.

واتە: موسڵمانان خوێن و ماڵ و ناموسیان لەیەکتری حەرامە.

وە دەفەرموێ: ( إن أربى الربا الإستطالة في عرض مسلم بغير حق) رواه أبو داود.

واتە: خراپترین سوو خواردن دەم درێژی کردن و بریندارکردنی شەرەف و ئابڕووی موسڵمانێکە بەناحەق.

وە دەفەرموێ: (أي رجل أشاع عن رجل مسلم بكلمة هو منه بريء بشينه بها في الدنيا كان حقا على اللـه أن يذيبه يوم القيامة في النار حتى يأتي بنفاذ ما قال) -رواه الطبراني بإسناد جيد-

واتە: هەرکەسێک قسەیەک بەدەم موسڵمانێکەوە هەڵبەستێ و بڵاوبکاتەوە لەکاتێکدا ئەو مسوڵمانە لەو شتە بێبەریبێ و نەیکردبێت و بەهۆی ئەمەوە ناشیرین ببێ، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بەقەدەر ئەو تاوانەی دەیهاوێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە. لە گێڕانەوەیەکی کەیدا هاتووە (هەرکەسێ شتێ بۆ موسڵمانێ دروست بکات بۆوەی ناوی بزڕێنێو ناشیرینی بکات. خوای گەورە بارتەقای ئەوە لەسەر پردی دۆزەخ حەپسی دەکات).

ج- شایعە دەبێتە هۆی ئاژاوەو دووبەرەکیو ترس و لەرز، ئیسلامیش ڕێی لەمە گرتووە، لەفەرموودەیەکدا هاتووە:

(لايحل لمسلم أن يروع مسلما) رواه مسلم، بۆ هیچ موسڵمانێک ڕەوا نیە موسڵمانێ بتۆقێنێو ئاسایشی لێهەڵگرێت.

هەروەها دەفەرموێ: (من أخاف مؤمنا كان حقا على اللـه ألا يؤمنه من فزع يوم القايمة) رواه الطبراني.

واتـە: *هەرکەسێ بڕواداریّ بترسێنێ، ئەوا خوای گەورە لەترس و داچڵەکانی ڕۆژی دوایی ناپاریزیّ*، دیارە مەبەست لێرەدا بڕواداریکی بێتاوانە.

گومانی تیا نیە کە شایەعە ترس و لەرز دەنێتەوە. خوای گەورەش بەتوندی سەرزەنشتی ئەوانە دەکات خەریکی درۆو دەلەسە بلاوکردنەوەن و ڕێو شوێنی سەختی بەرامبەریان داناوە:

(لئن لم ينته المنافقون والذين في قلوبهم مرض والمرجفون في المدينة لنغرينك بهم، ثم لا يجاورونك فيها إلا قليلا، ملعونين أينما ثقفوا أخذوا وقتلوا تقتيلا) الأحزاب/٦٠،٦١.

قرطبی دەڵێ: (مرجفون) کۆمەڵێبوون هەواڵی دڵتەنگ کەرو خراپیان لەبارەی دوژمنەکانیانەوە بەبڕواداران دەدا ،کاتێ تیپەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچوون دەیانوت: کوژراون و بەزیون و وا دوژمن بەڕێوەیە بۆتان، هەروەها قرطبی لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە (الأرجاف) دەستەدامێن بوونی ئاژاوەو فیتنەیە. هەروەها یانی بلاوکردنەوەی درۆو دەلەسەو شتی ناڕاست و بەتاڵ و بۆ سوودیکی تایبەتی، وە مانای (لنغيرتك بهم) یانی بەسەریانا زاڵت دەکەم بەنەفرین لێکردن و کوشتن و وەدەرنانیان، کاتێ سورەتی (براءة) دابەزیّ دووڕووەکان لەگەڵ بڕواداراندا لە مزگەوتدا لەنوێژی هەینیدابوون، پێغەمبەری خوا لە وتارەکەیدا وتی: ئێوە دووڕووتان تیایە، هەرکەسێکم بەناوی خۆیەوە بانگ کرد با لە مزگەوت بڕواتە دەرەوەو ئیتر توخنی مزگەوت نەکەویت دوای ئەمڕۆ، فلانەکەس تۆ دووڕوویت... جا برا موسڵمانەکانیان لێیان ڕاپەڕین و وەدەریان نان.

٢) خوای گەورە خاوەنی هەواڵی درۆ بە (فاسق) ناودەبات و دەفەرموێ:

(يا أيها الذين آمنوا إن جاءكم فاسق بنبأ فتبينوا أن تصيبوا قوما بجهالة فتصبحوا على ما فعلتم نادمين) الحجرات/٦.

واتە: ئەی باوەڕداران کاتێ (فاسق)یک هەواڵیکی بۆ هێنان یەکسەر هەواڵەکەی لێوەرمەگرن و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە ئەنجام بدەن، نەکا بەهۆی ئەم هەواڵەو بەنەزانی کۆمەڵێ بەدەستی ئێوە تووشی خراپە بێت و ئێوەش لە کارەکانتان پەشیمان بن.

ئەم ئایەتە بەبۆنەی ڕووداوی (وەلیدی کوڕی عطیەی کوڕی ئەبی موعیت)ەوە دابەزیوە کاتێک پێغەمبەر ﷺ کردی بە والی (بنی المصطلق) تاکو زەکاتیان لێوەرگریّ، بەلام لەبەر کۆنە قینێکی کاتی نەفامی ترسا

لیان و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرو پێی ڕاگەیاند، کە زەکاتیان پێنەداوەو نیازیان بووە بیکوژن.

پێغەمبەر ﷺ ویستی بدا بەسەریانا، بەڵام ئەم خێڵە هاتن و نکولیان لە هەواڵەکەی وەلید کرد.

٣) **خوای گەورە خاوەن شایعەی بەشەیتان ناوبردووە**، ئەوەتا لەبارەی (نعيم بن مسعود الأشجعي) کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو، وە ویستی سوپای موسڵمانان لەجەنگی بەدری بچوکدا تووشی شکان و بەزین بکات، دەفەرموێت: (إنما ذلكم الشيطان يخوف أولياءه فلا تخافوهم) آل عمران/١٧٥.

ئەوە شەیتانەو دۆستەکانی خۆی دەترسێنێ لێیان مەترسن.

٤) **وە وەسفی** (المرجفين) **دەکات ئەوانەی جگە لە شەڕ شتێکی تریان ناوێ بۆ خەڵکی کە دڵیان نەخۆشە** (في قلوبهم مرض فزادهم الله مرضا ولهم عذاب أليم بما كانوا يكذبون) البقرة/١٠.

دڵیان نەخۆشەو خوای گەورەش زیاتر نەخۆشی خستوون، وە لەبەرامبەر ئەو درۆیانەی کە دەیکەن و ئەو بێباوەڕیەی نیشانی دەدەن خوای گەورە سزایەکی سەختیان دەدات، شەڕویستن بۆخەڵکی لەسیفەتی باوەڕداران نیە، لەفەرموودەیەکی دا هاتووە: (لايؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) هیچ کامتان بەباوەڕداری تەواو ناژمێردرێن تا ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ برا موسڵمانەکەشت پێت خۆش بێت.

## دووەم / بڕواکردن بە شایعە

*ئیسلام بڕواکردن بە شایعەی بەحەرام داناوەو ڕێو شوێنەکانی ئەم حەرام کردنەش بەم جۆرەیە:*

١- گوێ لە درۆگرتنی حەرام کردووە بەیەکێ لە سیفەتەکانی جولەکەو دووڕووەکان داناوە، ئەوانەی کە تەنها خراپەیان بۆموسڵمانان دەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (ومن الذين هادوا سماعون للكذب ) المائدة/٥١.

واتە: *هەندێ لە جولەکەکان ئیش و پیشەیان گوێ لە درۆگرتنە.*

٢- ڕازی نیە مرۆڤ شوێن شتێک بکەوێت زانیاری پێی نەبێت و هەروا بەکوێرانە دوایکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

(ولا تقف ما ليس لك به علم إن السمع والبصر والفؤاد كل أولئك كان عنه مسئولا) الإسراء/٣٦.

*هەڵوێست مەگرە لەبارەی شتێکەوە کە زانیاریت دەربارەی پێنییە، دەبێ هەموو ئامرازەکانی زانیاری بۆ ساغ کردنەوەی هەواڵ و باسەکان بەکاربێنی، مرۆڤ لەبەرامبەر توانای بیستن و بینین و لێکدانەوەیدا بەرپرسیارە.*

٣ قەدەغەی کردووە مرۆڤ شوێن گومان (ظن) بکەوێت و بەسیفەتیکی خوانەناسانی لەقەڵەم داوە، بڕواکردن بە شایعەش شوێن گومان کەوتنە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وما لهم به من علم إن يتبعون إلا الظن وإن الظن لايغني من الحق شيئا) النجم/٢٨.

واتە: *زانیاریان پێی نیەو تەنها شوێنی گومان دەکەون و گومانیش شوێنی حەق ناگرێتەوەو مرۆڤ ناگەیەنێت بە راستی.*

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: (يا أيها الذين آمنوا اجتنبوا كثيرا من الظن إن بعض الظن إثم) الحجرات/١٢.

واتە: *ئەی بڕواداران لە زۆر گومان دوورکەونەوە چونکە هەندێ گومان تاوانە*، وەلەبارەی رووداوی (افک)ەوە کە رابەری دووڕووەکان (عبدالله بن ابی سلول) بڕەوی پێداو (حسان بن ثابت و مصلح بن أثاثەو بنت جحش)ی لەگەڵدا بوو، لەدژی عائیشەی دایکی بڕواداران دەفەرموێ: (لولا إذ سمعتموه ظن المؤمنون والمؤمنات بأنفسهم خيرا وقالوا هذا إفك مبين) النور/١٢.

ئەوەبوو لەساڵی (الحدیبیة)دا ئەوە رووی‌دا کە پێغەمبەر ﷺ (عثمانی کوڕی عفان)ی نارد بۆ لای قوڕەیش تا پێیان راگەیەنن ئەم بۆ شەڕ نەهاتووەو تەنها بۆ عەمرەکردن هاتووە. بەڵام هەندێ دواکەوت بۆ ئەوەی بەیوەندی بە کۆمەڵێ باوەڕداری ناو مەککەوە بکات بۆ ئەوەی مزگێنیان بداتێ کە رزگارکردنی مەککەو سەرکەوتنی خوایی نزیکە، کاتێ ئەو ماوەیە دیار نەما، موسڵمانان وتیان: عثمان لەپێش ئێمەوە خۆی گەیاندە ماڵی خواو تەوافی کرد، پێغەمبەر فەرمووی بڕواناکەم (عثمان) چووبێ تەوافی کردبێت و ئێمەش لێرەدا گیرمان خواردووە وتیان: دەبێ چی رێی لێ‌بگرێت ئەی پێغەمبەری خوا خۆت دەزانی وا رۆیشتووەو پێش کەوتووە؟ فەرمووی: وا گومان دەبەم دەربارەی کە تا ئێمەش لەگەڵیا تەواف نەکەین تەواف ناکات. (عثمان) گەڕایەوەو موسڵمانان بەو گومانەوە چوون بەرەوپیری. گومانەکەیانی بەدرۆخستنەوەو سوێندی خوارد کە ئەگەر یەک ساڵی رەبەق ئەولەمەککەدا بمایەوەو پێغەمبەریش لە(حدیبیة) هەڵی‌دابێ. تەوافی

کەعبەم نەدەکرد تا پێغەمبەر ﷺ تەوافی نەکردایە. وە قورەیش بانگی کردووە بۆ تەواف کردن، بەڵام ئەو قایل نەبووە.

جا موسڵمانان لێک وتیان: پێغەمبەری خوا لەهەمووومان زاناترە بەخواو لەهەمووشمان گومان چاکترە.

٤- ئیسلام فەرمانی کردوە پەلەنەکرێت لە بڵاوکردنەوەی هەواڵ و دەنگ و باس تا جوان سەرنجی نەداو ساغ نەبێتەوە.

ئەوەندە بەس نی یە بۆ مرۆڤ کە هەواڵێ رەت کاتەوەو باوەڕی پێنەکات. بەڵکو پێویستە تاووتوێی بکات و لەبارودۆخەکەی بکۆڵێتەوە. چونکە ئەشێ نیازو مەبەستی کەلاو لەپشت بڵاوکردنەوەیەوە هەبێت ئیتر دوای لێکۆڵینەوە ئەوە روون دەبێتەوە باوەڕی پێبکرێت یان بەدرۆ بخرێتەوە؟

خۆ ئەم لێکۆڵینەوە لەهەندێ شتی ترسناکی وەک و مەسەلەی شەرەف و جەنگدا ئەوە دەبێت زیاتر داکۆکی لەسەر بکرێت. ئەوەتە خوای گەورە لەرووداوی (الإفك)دا داوائەکات پێش ئەوەی ئەم هەواڵە بڵاوبکرێتەوە لێی بکۆڵرێتەوەو راستیو ناڕاستی دەربخرێت و. (لولا جاءوا عليه بأربعة شهداء فـأن لم يأتوا بالشهداء فأولئك عندالله هم الكاذبون) النور/١٣.

ئەوەتە خوای گەورە داوای چوار شایەتیان لێدەکات، وە ئەگەر ئەم شایەتانە نەیەنن ئەوا ئەوانەی ئەم بوختانە دەکەن لای خوای گەورە بەدرۆزن لەقەڵەم دەدرێن.

وە پێغەبمەریش ﷺ دەربارەی پیاوێ کە تۆمەتی زیناکردنی دابووە پاڵ ژنەکەی فەرمووی:

( یان شایەت دەهێنی یان داری حەدت لێدەدرێت) رواه البخاري ومسلم. وە کاتێ (ولید) هەواڵی (بني مصطلق)ی دا بە پێغەمبەر کە زەکات نادەن وە ویستوویانە بیکوژن، خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ ئەوەی لەڕاستیو ناڕاستی هەواڵ و مەسەلەکە بکۆڵێتەوە. سەیری کرد شتەکە پێچەوانەی ئەوەیە کە وەلید دەیڵێ، چونکە بانگ دەدەن بۆ نوێژکردن و زەکاتیشیان هێناوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ .

لە جەنگی (بني المصطلق)یشدا، عبداللەی کوڕی ابی کوڕی سلول رێبەری دووڕووەکان وتی: (لئن رجعنا إلى المدينة ليخرجن الأعز منها الأذل) المنافقون/٨.

واتە: *کاتێ گەڕاینەوە بۆ ناو شاری مەدینە ئەوا ئەو ئانە سەربەرزەکان سەرشۆڕەکان لەشار وەدەردەنێن.* زەیدێ کوڕی ئەرقەم کە لاوێکی تازە پێگەیشتووی دڵ گەرمی موسڵمان و هوشیار بوو ئەم هەواڵەی گەیاند بە پێغەمبەری خوا ﷺ : رەنگی پێغەمبەر ﷺ تێک چوو، ویستی لەوە بکۆڵێتەوە ئایا ئەم هەواڵە بەڕاستی گەیەنراوە، فەرمووی رۆڵە لەوانەیە رقت لێی هەستابێو ئەمە دەڵێی، وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا بەگوێی خۆم بیستوومە. فەرمووی: کێ دەڵێ گوێچکەت هەڵەی نەکردووە. لەریوایەتێکی (تجاری)دا هاتووە کە زەید دەڵێ: پێغەمبەر بڕوای بە قسەکەی من نەکردو قسەکەی ئەوانی بەڕاست زانی کە (نەفیان کرد). ئەمە تووشی پەژارەیەکی وای کردم کە لەوەو پێش هەرگیز تووشی پەژارەی وا نەبووم، چووم لەماڵەوە لێی دانیشتم، تا خوای گەورە سورەتی :(المنافقين)ی ناردە خوارەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی (زەید) خوای گەورە راستی قسەکەتی دەرخست.

حەزرەتی (عەلی)یش دەفەرموێ: *هەرکەسێ براکەی بەدینداریو گرتنی رێبازی راست بناسێ با گوێ لە قسەلۆکی خەڵکی نەگرێ لەبارەیەوە* چونکە *هی وایە قسە هەڵدەگێڕێتەوەو حەق دەکات بە ناحەق خواش چاودێرو بیسەرە*، دەبێ ئەوەش بزانین یەکێ لە ئامرازەکانی لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوەی هەواڵ گێڕانەوەیەتی بۆ لایەنە بەرپرس و پسپۆڕەکان بۆ ئەوەی راستیو ناڕاستی ئەو هەواڵانە دەرکەوێ کە لێرەو لەوێو رۆژانەدا بڵاودەکرێنەوە.

لەم رووەوە ئایەتێکی قورئان هەیەو سەرنجمان بۆ لای ئەم مەسەلە گرنگە رادەکێشێ.

( وإذا جاءهم أمر من الأمن أو الخوف أذاعوا به ولو ردوه إلى الرسول وإلى أولي الأمر منهم لعلمه الذين يستنبطونه منهم) النساء/٨٣.

واتە: *کاتێ هەواڵێکیان پێدەگات لە (کاتی ئاسایشدا بێ یان ترس و لەرز) دەچن یەکسەر بڵاوی‌دەکەنەوە. بەلام ئەگەر بیگێڕنەوە بۆ لای پێغەمبەرو بەرپرسیارەکانیان ئەوا شیان دەکردەوەو راستیی هەواڵەکەیان پێدەگوتن و هەڵوێستییان لەو بارەوە بۆ دیاری‌دەکردن*، کۆمەڵێ لە دووڕووەکان هەبوون کە هەواڵی تیپەکان (سرایا) دەقۆستەوەو باسیان دەکردو لەناو خەڵکا بڵاویان دەکردەوە. پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەسیفەتی ئەوەی لایەنی رەسمی کارەکەیە لەبارەی کاروباری لەم جۆرە

گرنگ لێدوانێ بدات و شتێ باس بکات. چونکە بڵاوکردنەوەی لەهەردوو حاڵەتی شەڕو ئاشتیدا زیانی هەبوو. لەحاڵەتی سەرکەوتنی تیپەکەدا هەواڵی موسڵمانان دەگات بە دوژمنەکانیان و دەشێ ئەمەش وا لە دوژمنەکانیان بکات بوروژێن و هەوڵی تۆڵەسەندنەوە بدەن، لەکاتی تێکشکاندیشدا، دەبێ بەمایەی دڵخۆش کردنی دووڕووەکان و دابەزینی ورەی باوەڕدارە لاوازەکان، هەروەها ئازاردانی دڵی پێغەمبەرﷺ.

ئەم ئایەتە ڕێکخستنێکی ئیسلامی کاروباری دەوڵەتە، کە پێویستە لایەنێکی ڕەسمی یان قسەکەرێکی ڕەسمی هەبێ بۆ وەرگرتنی هەواڵە گرنگەکان و بڵاوکردنەوەیان، یان شاردنەوەیان لەبەر بەرژەوەندی گشتی، ئەم قسەکەرانەش دەبێ بەتواناین و توانای لەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتیان هەبێت، چونکە ئەشێ زیانێکی زۆری تیا بێت، بەیاننامە ڕەسمیەکانی کاتی جەنگ شێوەیەکە لەشێوەکانی ئەم ڕێکخستنە، پێویستە لەلایەن کەسانێکەوە داڕێژرێو بڵاوبکرێتەوە خاوەنی تێگەیشتنێکی قووڵ بن و دڵسۆزی بەرژەوەندییەکانی گەل بن.

## سێهەم: وتنەوەی شایعە:

ئیسلام گوێزانەوەی شایعەو بڵاوکردنەوەو دووبارەکردنەوەو وتنەوەی قەدەغەکردووە. فەرمانی کردووە کە نەهێڵرێ یان هیچ نەبێ لەبازنەیەکی تەنگ دا قەتیس بدرێت، چونکە کاتی دەگوێزرێتەوە خراپەکەی زیاتر دەبێ، چونکە خەڵکانێکی تازە دەیبیستن و زیادەی تری دەخەنە سەرو ئەوەندەی تر دەشێوێنرێت.

*ئەم ڕێوشوێنە ئیسلامیەش لەم هەنگاوانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:*

١- ئیسلام فەرمانی کردووە مرۆڤ پێش ئەوەی گومانی خراپ بەرێ (بەتایبەتی بەرامبەر ئەوانەی جێگای گومانی خراپ پێبردن نین) گومانی چاک بەرێت، لەمەوپێش باسی ئەمە کرا، ئەمەش بەربەستێ لەرووی شایعەدا دروست دەکات و ناهێڵێ لەم سنوورە تێپەڕێت.

٢- فەرمانی کردووە خۆ دووربگرین لە گوێزانەوەی شتی ناهەق و وتنەوەو دووبارەکردنەوەی چونکە ئەمە شایستەی باوەڕدار نییە، خوای گەورە لەبارەی رووداوی (الإفك)ەوە دەفەرموێت:

